که ئومێدی ئەوە دەداتەوە بەمرۆڤ تا لەگەڵ بنەما خاوێن و پیرۆزەکاندا یەکبگرێتەوە، زمانی ئەدەب و داهێنانی بەرهەمی هونەرییە بەگشتی. لەوەدا کە زمانی هونەر، زمانی لادانە لەزمانی ڕۆژانە و شکاندنی بەربەستە گراماتیکیەکانە، ئەوە توانایشی هەیە ئاستی بەکارهێنانی ئامرازیانەی زمان بۆ ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردنی ئێمە بەشتەکان ڕەتبکات، بمانباتە ئەودیو سنووری چاوەڕوانییەکانی ماناییەوە، داوەتمان بکات بۆ قەڵەمڕەوی مانا دەروونی و نادیار و هێشتا دروستنەبووەکان(١٠).

ئەگەر بشیێت ئەنجامگیرییەکی سەرەتایی بدەم بەدەستەوە، دەبێت بڵێم: ئێمە لەگەڵ (ئێوارەی پەروانە)دا، پێش هەموو شتێك لەبەردەم بەرهەمێکی هونەریداین. بەرهەمێك، کە وەك جیهانێکی ئەڵتەرناتیڤ خۆی ئاشکرا دەکات و هەر ئەمەشە کە ڕێگەمان پێنادات وەك تێکستێکی بەڵگەنامەیی لەپەیوەندی بەواقیعێکی دیاریکراوەوە، بیخوێنینەوەو ڕاڤەی بکەین. واتە ڕەگەزێکی بەرگریکردن لەم بەرهەمەدا هەیە کە هەر لەسەرەتاوە سنوور بۆ خوێندنەوە تەقلیدیە ئاراستەکراوەکان دادەنێت، کە ئەو ڕەگەزەش ڕەهەندە ئێستاتیکیەکەیەتی. لێرەشەوە، وەك بەرهەمێکی هونەری دەیەوێت بەگوتەی هایدگەر، (بانگهێشتنمان بکات بۆ بوون لەجیهانێکی تردا). واتە وەك بەهەمێکی هونەری، سنوورە (نوقسانە)کانی زمانی پەیوەندیکردنی ڕۆژانەی ئێمە ڕەت دەکات، (کە هەمیشە دەبێت بەئەنجامی ڕوون و لۆژیکیمان بگەیەنێت، یان ڕوونکەرەوە بێت) و ئەو پەیوەندییانە لەناو زمانێکی (کەمتر لۆژیکی)دا بەرهەمدەهێنێتەوە، بەبێ ئەوەی بتوانین چاوەڕێی ئەنجامگیریی کۆنکرێتی لێبکەین.

لێرەیەوە جیهانی (ئێوارەی پەروانە) هەڵگری ئاگاییەکە بەرامبەر بەخۆی وەك بەرهەمێکی هونەری کە بە (ئاگایی ئەفراندن) ناوی دەبەین. ئەم ئاگاییە دەسەڵاتی ئەوەی داوەتە بەرهەمەکە، تا بتوانێت کارکردی کۆمەڵایەتیانەی ئاڵوگۆڕی زمانیی ڕەتبکات و بەهۆی یەکسانکردنەوەی مرۆڤەکان بەجەوهەری خۆیان و شتەکان بە وشەکان، جیهانێکی ئەڵتەرناتیڤ بسازێنێ تا (کارکردی

گشتی) زمانی تێدا بەرجەستە ببێت. واتە کارکردی ئەفسانەیی و قودسیی و پەروەردگارانەی زمان. کارکردێك کە زمانی ئاڵوگۆڕیانەی تایبەتانەی مرۆڤ دەکەوێتە پەراوێزییەوەو لەسیمایەکی بەدنیاییبووی ئەو زمانە ئەزەلیو قودسیەش زیاتر، هیچیتر نییە..

(ئێوارەی پەروانە)، چ لەسەر مانا شاراوەکانی، چ وەك تێمپۆی نووسینو پاشان چ لە ناولێنانی کاراکتەرەکاندا، هەڵگری ڕەهەندێکی ئەڵتەرناتیڤی زمانییە، کە ڕێگەمان پێنادات بەئاسانی زەمەنەکەی بەکاتی دنیایی ئەندازە بگرینو زمانەکەی تەرجەمە بکەینەوە بۆسەر زمانی ڕۆژانە و تەمەنی قارەمانەکانی هەڵسەنگێنین، چونکە دەنگەکانی ئەم بەرهەمە بەڕۆحێکی ئەفسانەیی و زمانێکی مەلەکوتی و لە زەمانێکی بێکۆتاییدا دێنە دەنگ..

## پەراوێزەكان

(١) بەختیار عەلی: ئێوارەی پەروانە، ڕۆمان. لەبڵاوكراوەوكانی نێوەندی ڕەهەند بۆ لێكۆڵینەوەی كوردی، سوید:١٩٩٨.

(٢) ڕێبوار س: سۆفیستەكان: لەستایشی فەلسەفەی كەمایەتیدا. سوید، ١٩٩٨. بەشی نۆیەم، ل١٥٦–١٥٧و ١٦١–١٦٥.

(3) WALTER BENJAMIN: OM SPROG OVERHOVEDET OG IN: OVERSAT. SLAGMARKS ‹OM MENNESKETS SPROG 1989 P. 46.‹ RED. TORE ERIKSEN‹SKYTTEGRAVSSRRIE

(٤) بابك احمدی: خـا طـر ا ت ظـلـمـت. نشر مركز، چ: اول، تهران ١٣٧٦. ص ٣٥

(5) BENJAMIN: OP. PP. 44.

(٦) احمدی، هەمان س. پ.ل:٣٥.

(7) BENJAMIN: OP. PP. 41-41.

(8) HARMANN SCHWEPPENHAUSER: NAVN LOGOS- P. 21.‹ RED. T. ERIKSEN‹UTRYK. IN OVERSAT

(٩) احمدی، هـ.س.پ. ل٣٧.

(١٠) هـ.س.ل ٤٠.

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

**ڕەخنە و هزر:**

- دیاردەگەرایی تاراوگە، چاپی یەکەم: دەزگای باران، سوید ۱۹۹٥. چاپی دووەم: دەزگای ئاراس، هەولێر ۲۰۰۲
- نووسین و بەرپرسیاری، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری بینین، ئەمەریکا ۱۹۹۷
- سۆفیستەکان، چ۱ ستۆکهۆڵم ۱۹۹۸، چ۲ دەزگای سەردەم، سلێمانی ۱۹۹۹
- دنیای شتەبچووکەکان، دەزگای سەردەم، سلێمانی ۱۹۹۹
- کتێبی نالی، دەزگای موکریانی، هەولێر ۲۰۰۱
- نەتەوە و حەکایەت، دەزگای سپیرێز، دهۆک ۲۰۰۲
- قەفەسی ئاسنین، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی ۲۰۰۳
- مێژووی هزری کۆمەلایەتی، زنجیرەی هزر و کۆمەڵ ۲، هەولێر ۲۰۰۳
- هاوکاتی و هاوشوناسی، دەزگای سپیرێز، دهۆک ۲۰۰٤

**بەرهەمی ئەدەبی:**

- گۆرانییەک بۆ گوندە سووتاوەکان (شیعر)، کۆپنهاگن ۱۹۸۹
- کۆپنهاگن! (شیعر)، کانونفرهنگ ایران، دانمارک ۱۹۹٤
- زمانی عەشق، زەمەنی ئەنفال (شیعری) چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی ۲۰۰۰
- من و مارەکان (چیرۆک) مەڵبەندی لاوانی میدیا، سلێمانی ۱۹۹۹

**وەرگێران:**

- ئەفسانەی خۆشەویستی (سەمەد بیهرەنگی) ئەفسانەچیرۆک، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی ۱۹۸۳
- دەنگی پێی ئاو (سهراب سپهری) چ۱، ۱۹۸۹، چ۲ کۆپنهاگن ۱۹۹۰
- در امدی بر شعر معاصر کُردی، کۆپنهاگن، ۱۹۹۰

- **پیدرۆپارامۆ** (رۆمان)، خوان رۆلفۆ (بەهاوکاری ئازاد بەرزنجی) دەزگای سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩
- **دەروازەکانی کۆمەڵناسی** (منوچهر محسنی)، بەهاوکاری کۆمەڵێ وەرگێڕ، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠٠٢
- **ئەلبوومی کیژی جنۆکان** (چیرۆکی منداڵان لە دانمارکییەوە)، دەزگای سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢